# گۆڵزارێک لە تەفسیری
# سەلەف




کۆکردنەوەی:
باوکی مەریەم

# پێشەکی

قورئان چێژێکی تری هەیە کاتێ بە فەهمی سەلەف دەیخوێنێتەوە، چونکە لەکەسانێکی خاوەن عەقیدەی ڕاست و درووستەوە وەردەگریت و دوورن لە گومڕایی و لادان، کەسانێک کە هاوەڵێتی رسول الله یان کردووە ﷺ، هەروەها وتەکانیان ئارامی دەبەخشن بەدڵ و دوورت دەخەن لە ڕاڕایی و دوودڵی.

# گرنگی زانینی تەفسیر

**عمرو کوڕی مرة** دەفەرمووێت: نەڕۆشتووم بەئایەتێك لە کتابەکەی الله دا کە ماناکەیم نەزانیبێت ئیللا خەفەت باربووم، چونکە من بیستم الله دەیفەرموو: ﴿وَتِلۡكَ ٱلۡأَمۡثَـٰلُ نَضۡرِبُهَا لِلنَّاسِۖ وَمَا يَعۡقِلُهَا إِلَّا ٱلۡعَـٰلِمُونَ﴾.

[تفسير ابن أبي حاتم]

**إياس کوڕی معاوية** دەفەرمووێت: نموونەی ئەوانەی قورئان دەخوێننەوە و تەفسیرەکەی نازانن وەك نموونەی قەومێك وایە کە نامەیەکیان لەلایەن پاشاکەیانەوە بۆ هاتووە بەشەودا وە چرایان لەلا نییە، سەرلێشێواویەکەیان سەرسوڕهێنەر بوو نەیان دەزانی چی لەنامەکەدا هەیە، وە نموونەی ئەوەی کە تەفسیرەکەی دەزانێت وەکو نموونەی پیاوێکە کە بە چرایەکەوە هاتە لایان جا ئەوەی لە نامەکەدا بوو خوێندیانەوە.

[لجامع لأحكام القرآن]

## مەترسی تەفسیرکردنی قورئان بەبێ ئاثاری سەلەف

ئیمامی الدارمی دەفەرمووێت: بەڕاستی ئەمە کارەساتێك و ڕووداوێکی زۆر گەورەیە لە ئیسلامدا و زوڵمێکی زۆر گەورەیە، کە شوێنکەوتنی تەفسیری قورئانە بەبێ ئەثەر-پاشماوەی هاوەڵان و تابعین-، وازیان هێنا لەو گێڕانەوانەی کە صەحیحن لە قەولی رسول اللّٰه ﷺ، و هاوەڵەکانی و تابعین رضی اللّٰه عنهم.

[الرد على الجهمية ص١٢٢]

جیاوازی نێوان ئێمە و هاوەڵان لە خوێندنەوەی قورئان نیە، بەڵکو جیاوازییەکە لەوەیە ئەوان تەفسیری قورئانیان ئەزانی ئێمە نایزانین

عمر بن عبدالعزیز رحمە اللّٰه بە یەکێک لەوانەی وت کە تووشی شوبهەی قەدەرییەکان ببوو: (لقد قرؤوا منه ما قرأتم، وعلموا من تأويله ما جهلتم). هاوەڵان قورئانیان خوێندەوە وەک ئێوە، وە تەفسیری قورئانیان زانی کە ئێوە نەتانزانی.

[سنن أبي داود: ٤٦١٢]

بۆیە ناکرێ تەفسیری هاوەڵان بوونی هەبێ تۆش بڵێی من خۆم لە قورئان تێئەگەم ناگەڕێمەوە بۆ تەفسیری ئەوان وەک نەززامیەکان.

**سعيد كوڕی جبير** دەفەرمووێت: هەر کەسێك قورئان بخوێنێتەوە پاشان تەفسیری نەکات -نەیزانێت- وەك نابینا یان دەشتەکی -هیچ نەزان- وایە.!

[تفسير الطبري]

١ - الله تعالى دەفەرموویت: ﴿فَلَنَسْأَلَنَّ الَّذِينَ أُرْسِلَ إِلَيْهِمْ وَلَنَسْأَلَنَّ الْمُرْسَلِينَ﴾ [سورة الاعراف ٦] **مجاهد** دەفەرموویت: پرسیار لەوانە دەکرێت پێغەمبەرانیان بۆ هات دەربارەی (لا اله الا الله).

[تفسير ابن أبى حاتم]

٢ - الله تعالى دەفەرموویت: ﴿الَّذِينَ كَفَرُوا وَصَدُّوا عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ زِدْنَاهُمْ عَذَابًا فَوْقَ الْعَذَابِ﴾ [سورة النحل ٨٨] **ابن مسعود** دەفەرموێت: واتە کۆمەڵێ دووپشکیان بۆدێت کە ددانەکانیان وەک دارخورمای زۆر درێژ وەهایە.

[الزهد للامام أسد بن موسى]

٣ - الله تعالى دەفەرموویت: ﴿هُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ﴾ [سورة الحديد ٤] **سفيان الثوري** دەفەرموویت: لەهەر شوێنێك بن الله لەگەڵتانە مەبەست زانستەکەی الله یە. [السنة لعبد الله بن أحمد]

٤ - الله تعالى دەفەرموویت: ﴿إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلصُّمُّ ٱلْبُكْمُ ٱلَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ﴾ [سورة الانفال ٢٢] **مجاهد** دەفەرموویت: ئەوانەن شوێن حەق ناکەون. [تفسير الطبري]

٥ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿مِن شَرِّ ٱلۡوَسۡوَاسِ ٱلۡخَنَّاسِ﴾ [سورة الناس ﴿٤﴾]

**عبد اللّه بن عباس** دەفەرمووێت: شەیتان لەسەر دڵی نەوەکانی ئادەم نیشتووە، کاتێك بێ ئاگابوو دوو دڵی بۆ پەیدا ئەکات وە کاتێك یادی اللّٰه ی کرد وون ئەبێت. [مصنف ابن أبي شيبة]

٦ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿وقليل من عبادى الشكور﴾ [سورة سبأ ﴿١٣﴾]

**ابن عباس** دەفەرمووێت: کەمینەیەک لە بەندەکانم اللّٰه بە تاک ئەگرن لە پەرستندا «تەنہا اللّٰه ئەپەرستن» لە تەوحیدەکەیاندا.

[تفسير ابن أبي حاتم]

٧ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿والفتنة أشد من القتل﴾ [سورة البقره ﴿١٩١﴾]

**أبو عاليه** دەفەرمووێت: هاوبەش دانان بۆ اللّٰه زۆر توندتر و خراپترە لە کوشتن. [تفسير ابن أبى حاتم]

٨ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ﴾ [البقرة ﴿٢٥٥﴾]

**إبن مسعود** دەفەرمووێت: گەورەترین ئایەت لە قورئاندا ئەوەیە ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ﴾.

[فضائل القرآن لإبن ضريس]

٩ - الله تعالى دەفەرموویت: ﴿الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَتْلُونَهُ حَقَّ تِلَاوَتِهِ﴾ [البقرة ﴿١٢١﴾] **ابن عباس** دەفەرموویت: شوێنی دەکەون بەچاك ترین شوێنکەوتن، وە دەڵێت: حەڵاڵی بەحەڵاڵ دەزانن و حەرامی بەحەرام دەزانن، وە دەستکاری ئایەتەکان ناکەن و لەجێی خۆی لایبدەن.

**مجاهد** دەفەرموویت: کاری پێدکەن بەچاکترین کار پێکردن ئا ئەوانە ئیمانی پێدەهێنن.

**الحسن البصری** دەفەرموویت: کاردەکەن بەئایەتە موحکەمەکانی وە ئیمان ئەهێنن بەئایەتە موتەشابیهەکان، وە ئەوشتەی کەلێی تێنەگەن ئەیگەڕێنەوە بۆلای ئەو کەسەی کە پێی زانایە -واتە الله تعالى-.

[تعظيم قدر الصلاة للمروزي]

١٠ - الله تعالى دەفەرموویت: ﴿إِنَّهُ كَانَ عَبْدًا شَكُورًا﴾ [سورة الاسراء ﴿٣﴾]
**سلمان الفارسي** دەفەرموویت: بەڕاستی بۆیە نوح ناونراوە بەبەندەیەکی زۆر سوپاسگوزار چونکە کاتێک پۆشاکی لەبەر دەکرد دەیوت الحمد لله وە کاتێك نانی دەخوارد دەیوت الحمدلله.

[تفسير الطبری]

١١ - الله تعالى دەفەرموویت: ﴿فلا تجعلوا لله أندادا﴾ [البقرة ﴿٢٢﴾]

**ابن عباس** دەفەرمووێت: (الأنداد) شیرکە، زۆر شاراوەترە لە جێ پێی مێرولە لە سەر بەردێکی صافی ڕەش لە شەوێکی تاریکدا، هەیە دەڵێت: واللە سوێند بە ژیانی تۆ ئەی فلانە کەس وە سوێند بەژیانی خۆم، وە هەیە دەڵێت: ئەگەر ئەو سەگە نەبوایە ئەوا دز دەهات بۆمان، وە ئەگەر مراوی نەبوایە لەماڵەکەم دز دەهات بۆم، وە قسەی پیاو کە بەهاوەڵەکەی دەڵێت: ما شاء الله وشئت -ویستی الله و ویستی تۆی، وە قسەی پیاو کە دەڵێت: ئەگەر الله و فلان کەس... فلان کەسی تێمەکە، هەموو ئەمانە شیرکن.

[تفسیر ابن ابی حاتم]

١٢ - الله تعالى دەفەرموویت: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لاَ تُفْسِدُوا فِى الْأَرْضِ قَالُوا إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ﴾ [البقرة ﴿١١﴾] **ابن عباس** دەفەرموویت: ئێمە تەنها دەمانەوێت بەینی ئەم دوو کۆمەڵەیە چاك بکەین ئیمانداران و ئەهلی کتاب، الله تعالى ش فەرمووی: ﴿أَلا إِنَّهُمْ هُمُ الْمُفْسِدُونَ وَلَكِنْ لا يَشْعُرُونَ﴾ [البقرة ﴿١٢﴾]، واتە: ئاگاداربن، بەڕاستی هەر ئەوانە خراپەکارن و بەڵام هەستی پێناکەن.

[تفسیر ابن ابي حاتم]

١٣ - الله تعالی دەفەرموویت: ﴿أُولَـٰئِكَ جَزَاؤُهُمْ مَغْفِرَةٌ مِنْ رَبِّهِمْ﴾ [آل عمران ١٣٦]
**میمون کوڕی مهران** دەفەرموویت: لێخۆشبوونیان بۆ واجب بووە ئەوانەی کە استغفار دەکەن.
[تفسیر ابن أبي حاتم]

١٤ - الله تعالی دەفەرموویت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ وَأَوْلَادِكُمْ عَدُوًّا لَكُمْ فَاحْذَرُوهُمْ﴾ [التغابن ١٤] **مجاهد** دەفەرموویت: چونکە ئەوان هانی پیاوەکە دەدەن سەردانی خزمەکانی نەکات، هەروەها سەرپێچی اللهش بکات، ئەویش چونکە خۆشی دەوێت ناتوانێت بەقسەیان نەکات.
[تفسیر الطبری]

١٥ - الله تعالی دەفەرموویت: ﴿قال هَؤُلَاءِ بَنَاتِي إِن كُنتُمْ فَاعِلِينَ﴾ [الحجر ٧١]
**عبد الله کوڕی مبارك** دەفەرموویت: لوط علیه السلام فەرمووی: ئەگەر باوەڕ بێنن لێتانی مارە دەکەم.
[تفسیر سعید بن منصور]

١٦ - الله تعالی دەفەرموویت: ﴿وَلَا تَتَبَدَّلُوا الْخَبِيثَ بِالطَّيِّبِ﴾ [النساء ٢]
**مجاهد** دەفەرموویت: پەلە مەکە لە ڕزقی حەرام پێش ئەوەی ڕزقە حەڵاڵەکەت بۆ بێت. [تفسیر الطبری]

١٧ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ وَٱغْفِرْ لَنَا رَبَّنَآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ [الممتحنة ۝٥] **ابن عباس** دەفەرمووێت: بە دەسەڵاتیان مەکە بەسەرمانەوە توشی فیتنەمان بکەن.

**مجاهد** دەفەرمووێت: تووشی سزامان مەکە بەدەستیان، وە توشی سزامان مەکە لە لایەن خۆتەوە، ئەو کافرانەش بڵێن ئەگەر ئەمانە لەسەر حەق بوونایە تووشی ئەم سزا نەدەبوون.

[تفسير الطبرى]

١٨ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ أَن يُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ﴾ [البقرة ۝١١٤] **مقاتل کوڕی** سلیمان دەڵێت: ﴿أَن يُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ﴾ واتە: تەوحید. [تفسير مقاتل بن سليمان]

١٩ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿لَا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ [الحجرات ۝١]

**ابن عباس** دەفەرمووێت: شتێك مەڵێن پێچەوانەی قورئان و سوننەت بێت. [تفسير ابن حاتم]

٢٠ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ﴾ [الفرقان ٧٤] **ابن عباس** دەفەرمووێت: ﴿قُرَّةَ أَعْيُنٍ﴾ ئەوە نییە کە بیان بینی باش و جوانبن بەڵکو ئەوەیە کە ئەیان بینی گوێڕایەڵی فەرمانەکانی الله ن.

**أبا سەعید** دەفەرمووێت: ئەوەیە کە ئیماندار خێزانەکەی و منداڵەکەی دەبینێت گوێڕایەڵی الله تعالى دەکەن.

**ابن زەید** دەفەرمووێت: ئەوانەن کە داوا لە الله دەکەن هاوسەرەکانیان و منداڵەکانیان هیدایەت بدات بۆ ئیسلام.

[تفسیر الطبری]

٢١ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿فَإِذَا فَرَغْتَ فَانْصَبْ﴾ [الشرح ٧]

**ابن عباس** دەفەرمووێت: کاتێك تەواو بویت لە نوێژکردن، خۆت ماندوو بکە بە دوعا کردنەوە، وە داوا لە الله بکە، وە ئومێدت پێی هەبێت.

[تفسیر الطبری]

٢٢ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ غَـٰفِلًا عَمَّا يَعْمَلُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ۚ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ ٱلْأَبْصَـٰرُ﴾ [إبراهيم ٤٢]

**میمون کوڕی مهران** دەفەرمووێت: ئەم ئایەتە هەڕەشەیە بۆ زاڵمەکان و سەرەخۆشی کردن و دڵدانەوەیە بۆ زوڵم لێکراوەکان.

[تفسیر الطبري]

٢٣ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿فَمَا ظَنُّكُم بِرَبِّ ٱلۡعَـٰلَمِينَ﴾ [الصافات ﴿٨٧﴾]

**قتادة** دەفەرمووێت: کاتێك کە پێی گەیشتن و غەیری الله شتان پەرستووە. [تفسير الطبري]

٢٤ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنۡيَا﴾ [القصص ﴿٧٧﴾]

**ابن عباس** دەفەرمووێت: وازمەهێنە لەوەی لە دونیادا کاری تێدا بکەیت بۆ الله.

**مجاهد** دەفەرمووێت: کار بکە لەدونیاکەت بۆ ئاخیرەتەکەت.

**مقاتل کوڕی سليمان** دەفەرمووێت: بەشی خۆت واز لێمەهێنە لە دونیادا کە کاری تێدا بکەیت بۆ ئاخیرەتەکەت.

[تفسير مقاتل بن سليمان]، [تفسير الطبرى]، [تفسير ابن أبي حاتم]

٢٥ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿قَالَ قَدۡ أُجِيبَت دَّعۡوَتُكُمَا﴾ [يونس ﴿٨٩﴾]

**أبو هريرة** دەفەرمووێت: کاتێك موسى دوعای دەکرد، هارون آمين دەکرد بۆ دوعاکەی دەیفەرموو: آمين.

**محمد کوڕی کعب** دەفەرمووێت: موسى دوعای دەکرد و هارون یش آمين ی دەکرد، وە ئەو کەسەی دوعا دەکات و ئەو کەسەشی آمين دەکات شەریکن.

**مجاهد** دەفەرمووێت: لە دوای چل دانە ساڵ وەڵامی دوعاکەیان درایەوە.

[موسوعة التفسير المأثور]

٢٦ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿لِتَسْتَوُوا عَلَىٰ ظُهُورِهِ ثُمَّ تَذْكُرُوا نِعْمَةَ رَبِّكُمْ إِذَا اسْتَوَيْتُمْ عَلَيْهِ وَتَقُولُوا سُبْحَانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ﴾ [الزخرف ١٣]

**أبي مجلز** دەفەرمووێت: سوار ئاژەڵێك بووم جا وتم: ﴿سُبحانَ الَّذى سَخَّرَ لَنا هذا وَما كُنّا لَهُ مُقرِنينَ﴾ جا بیستم لە پیاوێك لە ئەهل و بەیت - کە سفیان دەڵێت: حسن کوڕی علي بوو رضي الله عنهما - فەرمووی: ئایا ئاوا فەرمانت پێکراوە؟ وتم: ئەی چۆن بڵێم؟

فەرمووی: فەرمانتان پێکراوە کە یادی نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بکەنەوە کاتێك سەرکەوتنە سەری.

دەڵێت: وتم: ئەی چۆن بڵێم؟

فەرمووی: دەڵێیت: الحمد لله بۆ ئەوەی کە هیدایەتی داوین بۆ ئیسلام، الحمد لله بۆ ئەوەی کە منەتی کرد بەسەرماندا بە محمد علیه الصلاة والسلام، الحمد لله بۆ ئەوەی کە گێڕاوینی لە باشترین ئوممەت کە دەرهێنراوە لە خەڵکی، جا ئەو کاتە تۆ یادی گەورەترین نیعمەتت کردووە، پاشان لەدوای ئەوە دەڵێیت: ﴿سُبحانَ الَّذى سَخَّرَ لَنا هذا وَما كُنّا لَهُ مُقرِنينَ ۝ وَإِنّا إِلى رَبِّنا لَمُنقَلِبونَ﴾.

[تفسير الطبري]

٢٧ - الله تعالی دەفەرموویت: ﴿وَمَنْ يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَى وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّى وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ وَسَاءَتْ مَصِيرًا﴾ [النساء ١١٥]

**عمر كوڕی عبد العزيز** دەفەرموویت: رسول الله ﷺ سوننەتی داناوە و وە خەلیفە ڕاشیدەكانیش سونەتیان داناوە،

دست پێوەگرتنی: بەڕاست دانانی كتێبی الله یە، وە تەواوكردنی گوێڕایەڵی الله یە، وە قوەتێكە بۆ دینی الله.

كەس بۆی نییە بیگۆڕێت و جێگۆڕكێی پێ بكات و سەیری پێچەوانەكەی بكات، هەر كەسێك دەستی پێوەبگرێت و شوێنی بكەوێت هیدایەت دراوە، وە هەر كەسێك سەری بخات سەرخراوە، وە هەر كەسێكیش پێچەوانەی بكات و شوێن ڕێگای جگە لە بڕواداران بكەوێت الله ڕووی وەردەگێڕێت بۆ ئەو شوێنەی ڕووی وەرگێڕاوە و دەیخاتە دۆزەخەوە كە ئەویش سەرەنجامێكی زۆر ناخۆش و سامناكە.

[تفسير ابن أبي حاتم]

٢٨ - الله تعالی دەفەرموویت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ وَأَوْلَادِكُمْ عَدُوًّا لَكُمْ فَاحْذَرُوهُمْ﴾ [التغابن ١٤]

**ابن عباس** دەفەرموویت: ئەوانە پیاوانێك بوون لە ئەهلی مەككە وە دەیان ویست بێن بۆلای پێغەمبەر ﷺ بەڵام هاوسەرەكانیان و منداڵەكانیان پشتیان كرد لەوەی كە بانگی دەكردن بۆ ئەوەی بچنە لای رسول الله،

جا کاتێك هاتنە لای رسول الله ﷺ خەڵکیان بینی کە تێگەیشتوون و شارەزا بوون لە دین، جا ویستیان سزایان بدەن، جا الله عز وجل ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ وَأَوْلَادِكُمْ عَدُوًّا لَّكُمْ فَاحْذَرُوهُمْ﴾. [سنن الترمذي]

٢٩ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ﴾ [البقرة ٢٢٥]

**عائشة** رضي الله عنها دەفەرمووێت: ئەم ئایاتە دابەزی دەربارەی وتەی پیاوە (کە دەڵێت): نەخێر واللە، بەڵێ واللە.

[صحيح البخاري]

٣٠ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ ۚ إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَامِ ۖ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا﴾ [الفرقان ٤٤]

**ابن عباس** دەفەرمووێت: وێنەی کافرەکان وەك حوشتر و کەر و مەڕ وایە، ئەگەر بەهەندێکیان بڵێیت: بخۆ، هیچ نازانێت لەوەی کە دەیڵێیت، تەنها ئەوە نەبێت کە دەنگت دەبیستێت، کافریش بەهەمان شێوەیە ئەگەر فەرمانی پێبکەیت بە چاکە یان ڕێگری لێبکەیت لە خراپە یان ئامۆژگاری بکەیت هیچ تێناگات لەوەی کە دەیڵێیت تەنها ئەوە نەبێت کە دەنگت دەبیستێت. [تفسير ابن أبي حاتم]

٣١ - الله تعالى دەفەرموویت: ﴿ثُمَّ أَوۡرَثۡنَا ٱلۡكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصۡطَفَيۡنَا مِنۡ عِبَادِنَاۖ فَمِنۡهُمۡ ظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ وَمِنۡهُم مُّقۡتَصِدٞ وَمِنۡهُمۡ سَابِقُۢ بِٱلۡخَيۡرَٰتِ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَضۡلُ ٱلۡكَبِيرُ﴾ [فاطر ٣٢]

**الحسن** دەفەرموویت: **السابقون**: هاوەڵانی محمد ن ﷺ،

وە **المقتصد**: پیاوێکە پرسیار دەکات دەربارەی ئاثاری هاوەڵانی محمد ﷺ جا شوێنیان دەکەوێت، وە **الظالم لنفسه**: مونافقێکە کە لێیان دابڕاوە.

[تفسير يحيي بن سلام]

٣٢ - الله تعالى دەفەرموویت: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ [الروم ٢١]

**الحسن البصري** دەفەرموویت: ﴿مَوَدَّةً﴾: جیماعە، وە ﴿وَرَحْمَةً﴾: منداڵە.

[تفسير ابن ابى حاتم]

**إسماعيل السدي** دەفەرموویت: ﴿مَوَدَّةً﴾: خۆشەویستیە.

[يحيى بن سلام]

٣٣ - الله تعالى دەفەرموویت: ﴿إِنْ يَكُونُوا فُقَرَاءَ يُغْنِهِمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ﴾ [النور ٣٢]

**أبو بكر الصديق** دەفەرموویت: گوێڕایەڵی الله بکەن لەوەی کە ئەمری پێکردوون لە هاوسەرگیری کردن، بۆتان جێبەجێ دەکات لەوەی کە وەعدی پێداون لە دەوڵەمەندی.

[تفسير ابن ابى حاتم]

**ابن مسعود** دەفەرمووێت: دەوڵەمەندی بەدەست بهێنن بە هاوسەرگیری کردن. [تفسير الطبری]

٣٤ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَجَسَّسُوا﴾ [الحجرات ۞]
**ابن عباس** دەفەرمووێت: الله تعالى نەهی کردووە لەوەی ئیماندار شوێن عەیب و کەم و کوڕی برا ئیماندارەکەی بکەوێت.
[تفسير ابن ابى حاتم]

٣٥ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿كَانَ تَحْتَهُ كَنزٌ لَّهُمَا﴾ [الكهف ۞]
**أبـو ذرى الغفاري** دەفەرمووێت: ئەو گەنجینەیەی الله تعالى باسی کردووە لە کیتابەکەی لەوحەیەک بوو لە ئاڵتونێکی ئەستوور نوسرابوو لەسەری: سەرم سوڕماوە لە کەسێک یەقینی بە قەدەر هەیە (واتە باوەڕی وایە ئەوەی الله بۆی نووسیوە هەر ئەوەیە) پاشان خۆی هیلاک ئەکات یان خۆی نارەحەت ئەکات! وە سەرم سوڕماوە لە کەسێک بیری ئاگری دۆزەخ دەکاتەوە و پاشان پێئەکەنێت! وە سەرم سوڕماوە لە کەسێک بیری مردن ئەکاتەوە و پاشان غافڵ و بێئاگا ئەبێت! لا إله إلا الله محمد رسول الله.
[أخرجه البزار ٩/٤٥٤]، [ابن ابي حاتم]

**علی کوڕی ابي طالب** دەفەرمووێت: ئەوە لەوحەیەک بوو لەئاڵتون نوسرابوو لەسەری: لا إله إلا الله محمد رسول الله، سەرم سوڕماوە لە کەسێک بیر ئەکاتەوە کە مردن حەقە چۆن دڵخۆش ئەبێت!؟ وە سەرم سوڕماوە لە کەسێک بیرئەکاتەوە کە ئاگری دۆزەخ حەقە چۆن پێئەکەنێت!؟وە سەرم سوڕماوە لە کەسێک بیرئەکاتەوە کە قەدەر حەقە چۆن غەمبار ئەبێت (واتە لەوشتانەی بەسەری دێت)؟!، وە سەرم سوڕماوە لە کەسێک دونیا ئەبینێت و گۆڕانی حاڵی خەڵکەکەی حاڵ لەدوای حاڵ (واتە لەناخۆشی بۆ خۆشی، لەدەوڵەمەندیەوە بۆ فەقیری...) چۆن دڵی ئارام ئەبێت پێی!؟.

[شعب الايمان]

**الحسن البصری** دەفەرمووێت: لەوحەیەک بوو لە ئاڵتون نوسرابوو لەسەری: بسم الله الرحمن الرحیم، سەرم سوڕماوە لەکەسێک ئیمانی هەیە چۆن غەفەتبار ئەبێت!؟ وە سەرم سوڕماوە لە کەسێک یەقینی بە مردن هەیە چۆن دڵخۆش ئەبێت!؟ وە سەرم سوڕماوە لە کەسێک دونیا ئەناسێت و گۆڕانی حاڵی خەڵکەکەی چۆن دڵی ئارام ئەبێت پێی!؟

[ابن جریر]

٣٦ - الله تعالى دەفەرموویت: ﴿إِنَّ إِبْرَاهِيمَ لَحَلِيمٌ أَوَّاهٌ مُّنِيبٌ﴾ [هود ۝٧٥]

**ابن مسعود** دەفەرموویت: ﴿أَوَّاهٌ﴾ واتە: (الدعاء) دوعای زۆر دەکرد.

[عبد الله بن وهب في الجامع]

٣٧ - الله تعالى دەفەرموویت: ﴿فَلْيَضْحَكُوا قَلِيلًا وَلْيَبْكُوا كَثِيرًا﴾ [التوبة ۝٨٢]

**ربيع کوڕی خثيم** دەفەرموویت: ﴿فَلْيَضْحَكُوا قَلِيلًا﴾ لە دونیادا، ﴿وَلْيَبْكُوا كَثِيرًا﴾ لە ئاخیرەتدا.

**ابن عباس** دەفەرموویت: ﴿فَلْيَضْحَكُوا قَلِيلًا﴾ لە دونیادا، ﴿وَلْيَبْكُوا كَثِيرًا﴾ لە ناو ئاگردا. [تفسير الطبري]

٣٨ - الله تعالى دەفەرموویت: ﴿وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً﴾ [لقمان ۝٢٠]

**ابن عباس** دەفەرموویت: لا اله الا الله یە.

[تفسير الطبري]

٣٩ - الله تعالى دەفەرموویت: ﴿يَعْلَمُونَ ظاهِرًا مِنَ الحَياةِ الدُنْيا وهم عَنِ الآخِرَةِ هم غافِلُونَ﴾ [الروم ۝٧] **ابن عباس** دەفەرموویت: ژیانی دونیا شارەزان لەبنیاد نانی دونیا، بەڵام جاهیلن بە ئاخیرەت.

**الحسن البصري** دەفەرمووێت: لێهاتووی و شارەزایی هەر یەکێک وای لێدێ بەدونیاکەیان درهەمێک لە سەرنینۆکی هەڵدەگێڕێتەوە و پێتەڵێت کێشەکەی چەندە، بەڵام نازانێ نوێژێکی جوان بکات.

[تفسیر ابن ابی حاتم]

٤٠ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ﴾ [البقرة ١٥٢]

**ابن عباس** دەفەرمووێت: یادم بکەن بەگوێڕایەڵیم، منیش یادتان دەکەم بەلێخۆشبوونم. [تفسیر البغوی]

**السدي** دەڵێت: هیچ عەبدێك نییە زیکر و یادی الله تعالى بکات، ئیللا الله تعالى زیکر و یادی دەکات، یادی ئیماندار ناکات ئیللا بەڕەحمەتەوە یادی دەکات -ڕەحمی پێدەکات-، وە یادی کافر ناکات ئیللا بە عەزابەوە یادی دەکات -عەزابی دەدات-.

**الربيع** دەفەرمووێت: بەڕاستی الله زیکر و یادی ئەو کەسە دەکات کە زیکر و یادی دەکات، وە زیادی دەکات -نیعمەتەکانی- بۆ ئەو کەسانەی کە شوکری دەکەن، وە عەزابی ئەوانە دەدات کە کافرن پێی.

[تفسیر الطبری]

٤١ - الله تعالی دەفەرمووێت: ﴿وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَىٰ﴾ [الشمس ٩]

**ابن عباس** دەفەرمووێت: بڕوای نەبوو بە لا اله الا الله و بەدرۆی زانی.

[تفسير الطبرى]

٤٢ - الله تعالی دەفەرمووێت: ﴿فَمَن يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ﴾ [البقرة ٢٥٦] **مالك كوڕی أنس** دەفەرمووێت:

الطاغوت ئەوەیە کە لە غەیری الله دەپەرسترێت.

[تفسير ابن ابى حاتم]

٤٣ - الله تعالی دەفەرمووێت: ﴿وَالَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ الزُّورَ﴾ [الفرقان ٧٢]

**مجاهد** دەفەرمووێت: گوێ لە گۆرانی ناگرن.

[تفسير الطبرى]

٤٤ - الله تعالی دەفەرمووێت: ﴿ٱلْآمِرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱلنَّاهُونَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ﴾ [التوبة ١١٢] **سعيد كوڕی جبير** دەفەرمووێت: ﴿ٱلْآمِرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾: فرمان بە تەوحید ئەکەن، ﴿وَٱلنَّاهُونَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ﴾: نەهی لە شیرك ئەکەن.

[تفسير ابن أبي حاتم]

٤٥ - الله تعالى دەفەرموویت: ﴿فَإِذَا قُضِيَتِ الصَّلَاةُ فَانتَشِرُوا فِي الْأَرْضِ وَابْتَغُوا مِن فَضْلِ اللَّهِ﴾ [الجمعة ١٠] **الحسن البصري** و **سعيد کوڕی جبير**، و **مکحول الشامي** دەفەرموون: ﴿وَابْتَغُوا مِن فَضْلِ اللَّهِ﴾: داواکردنی عیلمە.

[تفسير الطبری]

٤٦ - الله تعالى دەفەرموویت: ﴿وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ الغالِبونَ﴾ [الصافات ١٧٣]

**ابن دريد** دەفەرموویت: ئەوانە ئەهلی سوننەن.

[السنه للخلال]

٤٧ - الله تعالى دەفەرموویت: ﴿الَّذِينَ جَعَلُوا الْقُرْآنَ عِضِينَ فَوَرَبِّكَ لَنَسْأَلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ [الحجر ٩١] **ابن عباس** دەفەرموویت: ئەوانەن کە ئیمانییان بەهەندێکی قورئان هەیە و کافرن بە هەندێکی تری.

[تفسير القرآن من الجامع لابن وهب]

٤٨ - الله تعالى دەفەرموویت: ﴿قل فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَا أَكْبَرُ مِنْ نَفْعِهِمَا﴾ [البقرة ٢١٩] **ابن عباس** دەفەرموویت: ﴿قلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ﴾ : واتە: لە ئارەقدا دین کەم دەکات کاتێك دەیخۆیتەوە.

**سعيد کوڕی جبير** دەفەرمووێت: لەبەر ئەوەی لەخواردنەوەی ئارەق و قوماردا واز هێنان لەنوێژ و زیکری خوای تێدایە.

**ابن عباس** دەفەرمووێت: ﴿وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ﴾: ئەو لەزەت و خۆشیەیە کە دەستیان دەکەوێت لەکاتی خواردنەوەیدا.

**ابن عباس** دەفەرمووێت: ﴿وَإِثْمُهُمَا أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا﴾: ئەوەی کەدەیبات لە دین و ئەو تاوانەی کەتێیدایە زۆر گەورەترە لەو خۆشی و لەزەتەی کەدەستیان کەوتووە.

[تفسير ابن ابی حاتم]

٤٩ - الله تعالی دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ﴾ [البقرة ٢٢٢]

**الأعمش** دەفەرمووێت: ﴿التَّوَّابِينَ﴾: تەوبە دەکەن لە تاوان، ﴿الْمُتَطَهِّرِينَ﴾: خۆیان پاك دەکەنەوە لە شیرك.

[تفسير ابن حاتم]

٥٠ - الله تعالی دەفەرمووێت: ﴿يَهْدِي مَن يَشَاءُ إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ [البقرة ١٤٢]

**أبی العالية** دەفەرمووێت: هیدایەتیان دەدات بۆ دەرچوون لە شوبهات و گومڕایی و فیتنە. [تفسير ابن ابی حاتم]

٥١ - الله تعالى دەفەرموویت: ﴿يَعْمَلُونَ السُّوءَ بِجَهَالَةٍ﴾ [النساء ١٧]
**مجاهد** دەفەرموویت: هەموو کەسێک سەرپێچی پەروەردگاری بکات ئەوا نەزانە. [تفسير الطبري]

٥٢ - الله تعالى دەفەرموویت: ﴿لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مَّا أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ﴾ [الانفال ٦٣] **ابن مسعود** دەفەرموویت: ئەم ئایەتە دابەزی لەسەر ئەوانەی لە پێناو الله یەکیان خۆشدەوێت.
[تفسير ابن ابى حاتم]

٥٣ - الله تعالى دەفەرموویت: ﴿يُؤْتِي الْحِكْمَةَ مَن يَشَاءُ وَمَن يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا﴾ [البقرة ٢٦٩] **مجاهد** دەفەرموویت: (حیکمەتەکە) قورئانە، ڕاست پێکانەکەی دەدات بەهەر کەسێك بیەوێت.

**إبراهيم النخعي** دەفەرموویت: (حیکمەتەکە) تێگەیشتنی قورئانە.
[سنن الدارمی]

٥٤ - الله تعالى دەفەرموون: ﴿وَاعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ الْيَقِينُ﴾ [الحجر ٩٩]
**مجاهد** و **ابن زيد** و **سالم کوڕی عبد الله** و **حسن البصری** دەفەرموون: ﴿الْيَقِينُ﴾ واتە: مردن.
[تفسير الطبري]

٥٥ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِاللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ﴾ [يوسف ١٠٦] **عكرمة** دەفەرمووێت: پرسیاریان لێبکەیت -لەو موشریکانە- کێ دروستی کردوون؟ وە کێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە؟ دەڵێن: الله، ئەمە ئیمانەکەیان بوو بە الله، بەڵام غەیری الله تعالى یان دەپرست - ئەمەش شیرکەکەیانە.

[تفسير الطبري]

٥٦ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿وَإِذِ اعْتَزَلْتُمُوهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ إِلَّا اللَّهَ﴾ [الكهف ١٦] **عطاء الخراسانی** دەفەرمووێت: قەومی ئەو گەنجانە الله تعالى یان دەپەرست لەگەڵ الله ش خوای تری جیاوازیان دەپەرست بۆیە ئەم گەنجانە دوور کەوتنەوە لە پەرستنی هەموو خواکانی تر بەڵام دوور نەکەوتنەوە لە پەرستنی الله تعالى.

[تفسير ابن ابی حاتم]

٥٧ - الله تعالي دەفەرمووێت: ﴿يَأْخُذُونَ عَرَضَ هَذَا الْأَدْنَى وَيَقُولُونَ سَيُغْفَرُ لَنَا﴾ [الأعراف ١٦٩] **سعيد کوڕی جبير** دەفەرمووێت: کار و کردەوە دەکەن بە تاوان و سەرپێچی و دەڵێن: لە داهاتودا الله لێمان خۆشدەبێت.

[تفسير عبد الرزاق]

٥٨ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ الْعَذَابِ الْأَدْنَىٰ دُونَ الْعَذَابِ الْأَكْبَرِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ [السجدة ٢١] **ابن عباس** دەفەرمووێت: سزا و ئازاری دنیایان دەدات وەك نەخۆشی و بەڵا بۆ خۆیان و ماڵ و منداڵ و سامانیان بەڵکو بە هۆی ئەو تاقیکردنەوانەی کە تووشی بەندەکانی خۆی دەکات پەشیمان ببنەوە و تەوبە بکەن.

[تفسير الطبري]

٥٩ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿وَإِنْ كُنْتُم مِنْ قَبْلِهِ لَمِنَ الضَّالِّينَ﴾ [البقرة ١٩٨]

**سفيان الثوري** دەفەرمووێت: لە پێش قورئاندا.

[تفسير ابن أبي حاتم]

٦٠ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿فَوَيلٌ لِلمُصَلِّينَ ۝ الَّذينَ هُم عَن صَلاتِهِم ساهونَ ۝﴾ [الماعون] **ابن عباس** دەفەرمووێت: ئەوانەن کە نوێژەکانیان دوا دەخەن لەکاتەکەی خۆیدا. [تفسير الطبري]

٦١ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿أَنَّ الأَرْضَ يَرِثُها عِبادِيَ الصّالِحُونَ﴾ [الأنبياء ١٠٥]

**ابن عباس** دەفەرمووێت: زەوی بەهەشت.

[تفسير ابن أبي حاتم]

**سعيد كوڕی جبير** دەفەرموێت: ئەو زەویە زەوی بەهەشتە.

[تفسير الطبري]

٦٢ - الله تعالى دەفەرموێت: ﴿إِنَّ إِبْرَاهِيمَ لَأَوَّاهٌ حَلِيمٌ﴾ [التوبة ١١٤]

**ابن عباس** دەفەرموێت: لە لەسەرخۆی پێغەمبەر ئیبراهیم ئەوەبوو کاتێک یەکێک لە قەومەکەی ئازاری بدایە پێی ئەفەرموو: الله هیدایەتت بدات -هداك الله-.

[تفسير ابن أبي حاتم]

٦٣ - الله تعالى دەفەرموێت: ﴿وَبَدَا لَهُم مِّنَ اللَّهِ مَا لَمْ يَكُونُوا يَحْتَسِبُونَ﴾ [الزُّمَر ٤٧]

**مجاهد** دەفەرموێت: کار و کردەوەیان ئەنجام دەدا و وا گومانیان دەبرد کە چاکە و خێرە بەڵام لە ڕاستیدا تاوان و خراپە بوو.

[تفسير القرطبي]

٦٤ - الله تعالى دەفەرموێت: ﴿وَيَقُولُونَ يَاوَيْلَتَنَا مَالِ هَذَا الْكِتَابِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّا أَحْصَاهَا﴾ [الكهف ٤٩]

**سفيان الثوري** دەفەرموێت: پرسیاریان لێدەکرێت هەتا دەربارەی زەردەخەنەش، پێی دەوترێت: لەبەر چی زەردەخەنەت کرد ئەو ڕۆژە و ئەو ڕۆژە؟ [تفسير ابن ابی حاتم]

٦٥ - الله تعالى دەفەرموویت: ﴿وإن للذين ظلموا عذابا دون ذلك﴾ [الطور ﴿٤٧﴾]

**زاذان** دەفەرموویت: عەزابی قەبرە.

[السنه لعبد الله]

٦٦ - الله تعالى دەفەرموویت: ﴿إِن يَكُونُوا فُقَرَاءَ يُغْنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ﴾ [النور ﴿٣٢﴾]

**ابن عباس** دەفەرموویت: الله سبحانه فەرمانی کردووە بە هاوسەرگیری و هاندان بۆی، وە بەڵێنیشی پێداون لەمەدا کە دەوڵەمەندبن.

[تفسير ابن ابى حاتم]

٦٧ - الله تعالى دەفەرموویت: ﴿وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾ [المائدة ﴿٩٣﴾]

**الحسن البصرى** دەفەرموویت: ئەوانەن کە دەستیان بە سوننەتەوە گرتووە.

[تفسير ابن ابى زمنين]

٦٨ - الله تعالى دەفەرموویت: ﴿الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَتْلُونَهُ حَقَّ تِلَاوَتِهِ﴾ [البقرة ﴿١٢١﴾]، **عمر کوڕی خطاب** دەفەرموویت: کاتێك دەڕۆن بەو ئایەتانەی باسی بەهەشتە، داوای بەهەشت لە الله تعالى دەکەن، وە کاتێك دەڕۆن بەو ئایەتانەی باسی ئاگری دۆزەخ دەکەن پەنا بە الله دەگرن لە ئاگری دۆزەخ. [تفسير ابن ابى حاتم]

٦٩ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَاكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَاكُمْ﴾ [الأعراف ١١]

**ابن عباس** دەفەرمووێت: الله تعالى ئێوەی لە پشتی باوکتان دروستکردووە و پاشان لە ڕەحمی دایکتان شێوە و وێنەتانی کێشاوە.

[تفسير السفيان الثوري]

٧٠ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ [البقرة ٩]

**ابن جريج** دەفەرمووێت: لا إله إلا الله یان دەردەخست و ئاشکرایان دەکرد، دەیان ویست بەمە خوێن و ماڵیان بپارێزن، لەکاتێکدا لە نەفسیاندا غەیری ئەمە هەبوو - واتە شیرك هەبوو.

[تفسير ابن ابی حاتم]

٧١ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿وَنَادَى أَصْحَابُ النَّارِ أَصْحَابَ الْجَنَّةِ أَنْ أَفِيضُوا عَلَيْنَا مِنَ الْمَاءِ أَوْ مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ﴾ [الأعراف ٥٠]

**ابن عباس** دەفەرمووێت: پیاوێك بانگی براکەی دەکات: ئەی براکەم، بەڕاستی سوتاوم ئاوم پێبدە، ئەویش دەڵێت: الله تعالى حەڕامی کردووە لەسەر کافران.

[موسوعة ابن ابي الدنيا]

٧٢ - الله تعالى دەفەرموویت: ﴿وَٱجۡعَلۡنَا لِلۡمُتَّقِينَ إِمَامًا﴾ [الفرقان ﴿٧٤﴾]

**مقاتل کوڕی سليمان** دەفەرمووێت: وامان لێ بکەیت شوێنکەوتەی سەلەفی صالحمان بین، بۆ ئەوەی ئەوانەی دوای خۆشمان بن بە شوێنکەوتەی ئێمە.

[تفسير مقاتل بن سليمان]

٧٣ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿وَأَحْسِنُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ [البقرة ﴿١٩٥﴾]

**فضيل کوڕی عياض** دەفەرمووێت: بزانن ئەگەر بەندە چاکترینی چاکەکان بکات هەر هەمووی، بەڵام مریشکێکی هەبێت خراپ بێت بۆی، ئەوا یەکێك نیە لە ﴿الْمُحْسِنِينَ﴾ چاکەکاران.

[تفسير ابن ابى حاتم]

٧٤ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ﴾ [النساء ﴿١٢٣﴾]

**الحسن البصري** دەفەرمووێت: ئەمە بۆ ئەو کەسەیە کە الله بیەوێ سوکی بکات، بەڵام ئەوەی الله بیەوێ ڕێزی لێ بگرێ ئەوا لە تاوانەکانی خۆش ئەبێ. [سنن سعيد بن منصور]

**عطاء کوڕی أبي رباح** دەفەرمووێت: کاتێک ئەم ئایەتە دابەزی ابو بکر الصديق فەرمووی: پشت شکێنەر هات ئەی رسول الله،

رسول الله ﷺ فەرمووی: ئەمە ئەو موسیبەتانەن کە لە دونیادا تووشی دەبن. [تفسير ابن جريج]

٧٥ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلصُّمُّ ٱلْبُكْمُ ٱلَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ﴾ [الأنفال ٢٢] **مجاهد** دەفەرمووێت: ئەوانەن شوێن حەق ناکەون.

[تفسير الطبري]

٧٦ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ الأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ﴾ [المطففين ٢٢]

**الحسن البصري** دەفەرمووێت: ئەوانەن کە ئازاری هیچ شتێك نادەن تەنانەت مێرولەی زۆر بچوکیش.

[تفسير الطبري]

٧٧ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿فَأَرَدْنَا أَنْ يُبْدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيْرًا مِنْهُ زَكَاةً وَأَقْرَبَ رُحْمًا﴾ [الكهف ٨١] **سعيد کوڕی جبير** دەفەرمووێت: لەجێی کوڕەکە (الله تعالى) کچێکی پێدان.

[تفسير الطبرى]

**ابن عباس** دەفەرمووێت: لەجێی کوڕەکە (الله تعالى) کچێکی پێدان، کچەکەش دواتر پێغەمبەرێکی بوو.

[تفسير إسحاق البستي]

**يعقوب کوڕی عاصم** دەفەرمووێت: لەجێی کوڕەکە (الله تعالى) کچێکی پێدان. [تفسير الطبري]

٧٨ - الله تعالی دەفەرمووێت: ﴿إِذْ يَتَلَقَّى الْمُتَلَقِّيَانِ عَنِ الْيَمِينِ وَعَنِ الشِّمَالِ قَعِيدٌ﴾ [ق ۞١٧]، **مجاهد** دەفەرمووێت: لەگەڵ هەموو ئینسانێكدا دوو فریشتە هەیە، فریشتەیەك لەلای ڕاستیەتی، وە ئەوەی تریان لەلای چەپ، ئەوەی لای ڕاستی چاكە دەنووسێت، وە ئەوەی لای چەپیشی خراپە دەنووسێت. [تفسير الطبري]

**سفيان الثوري** دەفەرمووێت: پێمگەیشتووە كە (فریشتەی) نووسەری چاكەكان ئەمیرە بەسەر (فریشتەی) نووسەری خراپەكان، جا كاتێك تاوانێكی كرد، پێی دەڵێت: پەلەمەكە بەشكم داوای لێخۆشبوون بكات. [تفسير الطبري]

**الحسن البصري** ئەم ئایەتەی خوێندەوە جا فەرمووی: ئەی نەوەی ئادەم پەڕەی خۆتم بۆ كردوویتەتەوە، دوو فریشتەی بەخشندە كراونەتە سەركارت، یەكیان لەلای ڕاستتە، ئەوەی تریان لەلای چەپتە. ئەوەی لە ڕاستتە چاكەكانت بۆ دەنووسێت، وە ئەوەی لە لای چەپتە خراپەكانت بۆ دەنووسێت، جا چیدەكەیت بیكە، زۆر یان كەم، هەتا ئەوكاتەی دەمریت ئەوكاتە پەڕەكەت دەپێچرێتەوە، دەخرێتە گەردنت لەگەڵدایە لە قەبرەكەتدا، هەتا ڕۆژی قیامەت دێت، جا لەو كاتەدا دەفەرمووێت: ﴿وَكُلَّ إِنْسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَائِرَهُ فِي عُنُقِهِ وَنُخْرِجُ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كِتَابًا يَلْقَاهُ مَنْشُورًا ۞١٣ اقْرَأْ

كِتابَكَ كَفى بِنَفْسِكَ اليَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا ﴿١٤﴾ [الإسراء] سوێند بە اللە دادپەروەرە لەسەرت ئەوەی نەفسی خۆت دەکات بە حاسیب لەسەرت.

[تفسير عبد الرزاق]

٧٩ - اللە تَعالى دەفەرموێت: ﴿فَمَنِ اتَّبَعَ هُدایَ فَلا یَضِلُّ ولا یَشْقى﴾ [طه ﴿١٢٣﴾]

**ابن عباس** دەفەرموێت: هەر کەسێک قورئانی خوێندەوە و شوێنی ئەوە کەوت کەتێیدایە، خودای گەورە ڕێی ڕاستی نیشان دەدات لەناو گومڕاییەکان لەدونیادا، وە خودا دەیپارێزێت لەڕۆژی قیامەتدا لە لێپرسینەوە، فەرمووی: ئەوە وتەی پەروەردگارە: ﴿فَمَنِ اتَّبَعَ هُدایَ فَلا یَضِلُّ ولا یَشْقى﴾ [طه ﴿١٢٣﴾]. [تفسير عبد الرزاق]

٨٠ - اللە تعالى دەفەرموێت: ﴿فإنه كان للأوابين غفورا﴾ [الإسراء ﴿٢٥﴾]

**مجاهد** دەفەرموێت: ئەوانەن کە بەنهێنی تاوان دەکەن و بەنهێنیش تەوبە دەکەن. [كتاب الزهد الإمام أحمد]

٨١ - اللە تعالى دەفەرموێت: ﴿يَتْلُونَهُ حَقَّ تِلاوته﴾ [البقرة ﴿١٢١﴾]

**عمری کوڕی خطاب** رضي اللە عنە دەفەرموێت: ئەگەر بگەنە شوێنێك باسی بەهەشت بکات ئەوە داوای بەهەشت دەکەن، وە ئەگەر بگەنە شوێنێک باسی ئاگر بکات ئەوە پەنا دەگرن بە خوا لە ئاگر.

[موسوعة التفسير المأثور]

٨٢ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿وَعَمِلَ صالِحاً ثم اهْتَدَى﴾ [طه ٨٢]
**سعيد بن جبير** دەفەرمووێت: دەستگرتن بە سوننەت و جەماعەتەوە.
[الإبانة الصغرى]

٨٣ - **عقبة بن عامر** رضي الله عنه دەفەرمووێت: گوێم لە رسول الله ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەگەر بینیت کەوا الله بە بەندەیەك دەبەخشێت، وە ئەویش بەندەکە بەردەوامە لەسەر تاوانەکانی، ئەوا ئەوە (ئیستدراجە)، پاشان ئەم ئایەتەی الله خوێندەوە: ﴿فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّىٰ إِذَا فَرِحُوا بِمَا أُوتُوا أَخَذْنَاهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ﴾ [سُورَةُ الأَنعَامِ ٤٤]. [تفسير إبن أبي حاتم]

٨٤ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ﴾ [المَائِدَةِ ٩٨]
**مطرف** دەفەرمووێت: ئەگەر خەڵکی قەدری گەورەیی سزای الله و تورەبوونی الله و دابەزینی سزا بۆ سەریان بزانیایە، ئەوا فرمێسکیان دەڕشت و چاویان بۆ هیچ شتێ جێگیر نەدەبوو.
[تفسير ابن أبي حاتم]

٨٥ - الله تعالي دەفەرمووێت: ﴿فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهْدِيَهُۥ يَشْرَحْ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَـٰمِ﴾ [الْأَنْعَامِ ١٢٥] **رسول الله** ﷺ دەفەرمووێت: ئەگەر ئیمان چووە دڵێکەوە، ئەوا فراوان و هەستی دڵنیایی دووروست دەبێت.

وتیان: ئەی رسول الله ﷺ ئایە بۆ ئەمە هیچ نیشانەیەك هەیە؟ فەرمووی: بەڵێ، دەگەڕێتەوە بۆ ماڵی هەمیشەیی [واتە بیر لەقیامەت و ماڵی هەمیشەیی دەکاتەوە]، وە دووردەکەوێتەوە لە ماڵی بێهوودە [مەبەستی لە دونیایە]، وە خۆ ئامادەکردن بۆ مردن پێش ئەوەی بمرێت.

[تفسير إبن أبي حاتم]

٨٦ - الله تعالی دەفەرمووێت: ﴿أَفَمِن هَـٰذا الحَدِيثِ تَعجَبُون ٥٩ وَ تَضحَكُونَ وَلَا تَبكُون ٦٠﴾ [النجم] **الحسن بصری** دەفەرمووێت: سوێند بە الله ئەگەر قەومێکی عاقل بووینایە دەگریاین، وە بە دڵەکانمان دەگریاین، وە بە کردەوەکانمان دەگریاین، بەڵام ئێستا ئەگەر بەچاویش بگرین لەدڵەوە دڵمان رەقە.

[موسوعة التفسير المأثور]

٨٧ - الله تعالی دەفەرمووێت: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ۝٩ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ۝١٠﴾ [الشمس] **الحسن بصري** دەفەرمووێت: بێگومان بردوویەتییەوە کەسێک تەقوای الله کردبێت، وە بێگومان دۆڕاندووشیەتی کەسێک الله گومڕای کردبێت.

[شرح أصول إعتقاد أهل السنة والجماعة]

٨٨ - الله تعالی دەفەرمووێت: ﴿مَّسَّتْهُمُ الْبَأْسَاءُ وَالضَّرَّاءُ﴾ [البقرة ۝٢١٤] **إبن عباس** دەفەرمووێت: الله تعالی هەواڵی بە خەڵک داوە کە دونیاماڵی موسیبەت و بەڵاییە، وە الله تعالی بەوەی لە دونیادایە تاقییان دەکاتەوە، وە هەواڵیان پێ دەدات، کە ئاواشی لەگەڵ پێغەمبەران و بەندە دڵسۆزەکانی کردووە (ئەوانەی بە ئیخلاصەوە بەندایەتیان کردووە) بۆ پاک بوونەوەیی ناخیان ئەفەرمێت:

**عبد الله بن مسعود** دەفەرمووێت: ﴿الْبَأْسَاءُ﴾ واتە هەژاری.

**إبن عباس** دەفەرمووێت: ﴿الضراء﴾ واتە نەخۆشی.

[تفسير إبن ابي حاتم]

٨٩ - الله تعالى دەفەرموێت: ﴿قُلْ مَتَاعُ الدُّنْيَا قَلِيلٌ﴾ [النساء ۞]

**الحسن بصری** دەفەرموێت: هەموو ئەوەی لە دونیادا هەیە لە سەرەتاوە هەتا کۆتایی هیچ نیە جگە لەوەی وەک کەسێکی خەوتوو وایە کە لە خەویدا کۆمەڵێک شت دەبینێت کە حەزی پێیەتی پاشان بەخەبەر دێت.

[تفسير ابن أبي حاتم]

٩٠ - الله دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِنَفْسِهِ وَمِنْهُمْ مُقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌ بِالْخَيْرَاتِ بِإِذْنِ اللَّهِ ذَلِكَ هُوَ الْفَضْلُ الْكَبِيرُ﴾ [فاطر ۞] **الحسن** دەفەرموێت: ﴿السابقون﴾: هاوەڵانی محمد ن ﷺ، وە ﴿المقتصد﴾: پیاوێکە پرسیار دەکات دەربارەی ئاثاری هاوەڵانی محمد ﷺ جا شوێنیان دەکەوێت، وە ﴿الظالم لنفسه﴾: مونافقێکە کە لێیان دابڕاوە. [تفسير يحيى بن سلام]

٩١ - الله تعالى دەفەرموێت: ﴿وَعَمِلَ صالِحاً ثم اُهتَدَى﴾ [طـه ۞]

**سعيد بن جبير** دەفەرموێت: دەستگرتن بە سوننەت و جەماعەتەوە.

[الإبانة الصغرى]

٩٢ - الله تعالی دەفەرموێت: ﴿ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا يَكْفُرُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَيَقْتُلُونَ النَّبِيِّينَ بِغَيْرِ الْحَقِّ﴾ [البقره ۝٦١] **عبد الله بن مسعود** رضي الله عنه دەفەرموێت: نەوەی ئیسرائیل لە یەک رۆژدا (سێصەد ٣٠٠) پێغەمبەریان کوشتووە، وە دواتر لە هەمان رۆژدا دەچوونە بازار و خەریکی ئیشی و کاری رۆژەیان دەبوون!

[تفسير إبن ابي حاتم]

٩٣ - الله تعالی دەفەرموێت: ﴿الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَتْلُونَهُ حَقَّ تِلَاوَتِهِ﴾ [البقرة ۝١٢١] **ابن عباس** دەفەرموێت: واتە: شوێنی دەکەون بە چاکترین شوێنکەوتن، وە دەڵێت: حەڵاڵی بەحەڵاڵ دەزانن و حەرامی بەحەرام ئەزانن، وەدەستکاری ئایەتەکان ناکەن و لەجێی خۆی لایبدەن.

**مجاهد** دەفەرموێت: کاری پێدکەن بە چاکترین کار پێکردن ئا ئەوانە ئیمانی پێدەهێنن.

**الحسن بصرى** دەفەرموێت: کاردەکەن بەئایەتە موحکەمەکانی وە ئیمان ئەهێنن بەئایەتە موتەشابیهەکان، وە ئەوشتەی کەلێی تێنەگەن ئەیگەڕێنەوە بۆلای ئەو کەسەی کە پێی زانایە واتە الله تعالی.

[تعظيم قدر الصلاة للمروزي]

٩٤ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿قل متاع الدنيا قليل﴾ [النساء ٧٧]
مەیمونی کوڕی میهران دەفەرموێت: دونیا کەمە وە ئەو کەمەش ڕۆشت ئەوەی ماوەتەوە کەمێکە لەو کەمە.
[تفسير ابن أبي حاتم]

٩٥ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿فَإِذَا فَرَغْتَ فَانْصَبْ﴾ [الشرح ٧]
ابن عباس دەفەرمووێت: کاتێك تەواو بوویت لە نوێژکردن، خۆت ماندوو بکە بە دوعا کردنەوە، وە داوا لە الله بکە، وە ئومێدت پێی هەبێت.
[تفسير الطبرى]

٩٦ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿وَمَا لِلظَّـٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ﴾ [البقرة ٢٧٠]
شريح دەفەرمووێت: زاڵم چاوەڕێی سزا دەکات، وە مەزوڵومیش چاوەڕێی سەرکەوتن دەکات. [تفسير إبن أبي حاتم]

٩٧ - الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿إِنّ الإِنْسَانَ لِرَبّهِ لَكَنُودٌ﴾ [العاديات ٦]
ابن عباس، مجاهد، ابراهيم نخمی، ابو جوزا،ابو لعاليه، ابو زوحا، سعيد بن جبير، محمد بن قيس، زححاک، الحسن بصري، قتادة، ربيع بن انس، ابن زيد دەفەرموون: ﴿لَكَنُودٌ﴾ واتە (پێنەزان).
خەڵکی لەو بەهرانەی الله پێی بەخشیون پێنەزانن و دانی پێدا نانێن.
[تفسير الطبري]

**الحسن بصري** دەفەرموویت: ئەو کەسەیە کە بەسەرهاتە ناخۆشەکان دەژمێرێ و کەچی هەموو چاکەکانی اللّٰه ی لەبیر دەچیتەوە.

[تفسير إبن كثير]

٩٨ - اللّٰه تعالى دەفەرموێت: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾

**عمر کوڕی الخطاب** دەفەرمووێت: ئەوانەتان کە زیاتر لە (شیرک) خۆی دەپارێزێت. [الدر المنثور]

٩٩ - اللّٰه تعالى دەفەرمووێت: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ اللَّهُ﴾ [المائدة ٤٤]

**ابن عباس** دەفەرمووێت: هەر کەسێک ئینکاری حوکم کردن بکات بەوەی اللّٰه دایبەزاندووە ئەوا ئەو کەسە کافر بووە، وە هەر کەسێک دانی پێدا بنێت بەڵام حوکمی پێ نەکات ئەوا ئەو کەسە زاڵم و فاسقە، وە دەڵێت: وە هەر کەسێک ئینکاری یەک حوکم بکات لەحوکمەکانی اللّٰه ئەوا ئەو کەسە کافر بووە.

[تفسير إبن أبي حاتم]

١٠٠ - اللّٰه تعالى دەفەرمووێت : ﴿إن الانسان لربه لكنود﴾ [العاديات ٦]

**الحسن بصري** دەفەرمووێت : لۆمەی پەروەردگاری ئەکات، بەڵاکان ئەژمێرێ و ناز و نیعمەتەکان لە بیرئەکات.

[تفسير الطبري]

